# چۆنیەتی عومرە کردن

## لەڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە

نوسینی

أحمد ملا فائق سعید

١٤٤٠ كۆچی

چاپی پێنجەم

ناوی نامیلکە: چۆنیەتی عومرەکردن لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە

نووسینی: أحمد ملا فائق سعيد

ژمارەی لاپەڕە: ٧٨ لاپەڕە

قەبارەی لاپەڕە: ١٢ X ١٧ سم

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١١٩٧) ی ساڵی ٢٠١٢ ی پێدراوە



چاپی پێنجەم

١٤٤٠ هـ




کتێبخانەی صلاح الدين

هەولێر فلکەی شێخ محمود باڵەخانەی سید بهاء الدين

٠٦٦٢٥٤٠٢٧٦

# چۆنیەتی عومرە کردن

## لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە

نووسینی


أحمد ملا فائق سعيد



مكتبة صلاح الدين
للنشر والتوزيع



قَالَ تَعَالَى: ﴿وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾

[البَقَرَة: ١٩٦].

# صِفَةُ العُمْرَةِ

## فِي مَنْظُورِ الْقُرْآنِ وَالسُّنَّةِ

تأليف

أحمد ملا فائق سعيد

مكتبة صلاح الدين
للنشر والتوزيع

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ، فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٢].

وَقَالَ تَعَالَى: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا (١)﴾ [النساء: ١].

وَقَالَ تَعَالَى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا (٧٠) يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب: ٧٠-٧١].

قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كَلَامُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ»(١).

عومرەکردن عیبادەتێکە خاوەنی پلەوپایەیەکی تایبەتە لە ئیسلامدا، کە لەگەڵ حەجدا باسکراوە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَتِمُّواْ ٱلۡحَجَّ وَٱلۡعُمۡرَةَ لِلَّهِۚ﴾ [البَقَرَة: ١٩٦]. وە پێی دەوترێت حەجی بچووك.

عیبادەتیش یەکێك لە مەرجەکانی قبووڵبوونی بریتییە لە (المتابعة)، واتە دەبێت بەگوێرەی قورئان و سوننەت ئەنجام بدرێت.

عومرەکاریش هەموو ئەرکێکی ماڵی و سەفەر دەگرێتە بەر بۆ گەیشتن بەو وادە و پلەوپایە لێخۆشبوون و ڕەزامەندییە خواییەی کە لە فەرموودەکاندا پێیدراوە.

بۆیە ئەم نووسینە هەوڵێکە بۆ ئەنجامدانی عومرە بەو شێوازەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی داوە، بەگوێرەی فەرموودە (صحیح)ەکان، وە بۆ پڕکردنەوەی پێویستی ئەم سەفەرەش شێوازی نوێژی مردوو (صلاة الجنازة)شمان باسکردووە، لەبەر زۆر ئەنجامدانی ئەم نوێژە لە

---

(١) رواه مسلم (٨٦٧)، والنسائي في "الكبرى" (١٧٩٩)، وانظر "خطبة الحاجة" للألباني.

**حەرەمەیندا، بگرە لەگەڵ هەموو نوێژە فەرزەکاندا بوونی هەیە.**

داوام شوێنی ڕەزامەندی پەروەردگارە و بێبەش نەبوونە لە نزا و پاڕانەوەکانیان و گەڕانەوەیان بە عومرەیەکی قبوڵکراو و توێشوویەکی دوارۆژ

  



أحمد ملا فائق سعيد

١٩ / جمادى الآخرة / ١٤٤٠ هـ

٢٢ / ٢ / ٢٠١٩ م - الجمعة

سلێمانی

# پلە و پاداشتی عومرە

**١.** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «**العُمْرَةُ إِلَى العُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا**»[(١)].

**واتە: عومرە تا عومرەیەکی تر سڕینەوەی تاوانی نێوانیانە.**

**٢.** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «**تَابِعُوا بَيْنَ الحَجِّ وَالعُمْرَةِ، فَإِنَّهُمَا يَنْفِيَانِ الفَقْرَ وَالذُّنُوبَ كَمَا يَنْفِي الكِيرُ خَبَثَ الحَدِيدِ، وَالذَّهَبِ، وَالفِضَّةِ، وَلَيْسَ لِلْحَجَّةِ المَبْرُورَةِ ثَوَابٌ إِلَّا الجَنَّةُ**»[(٢)].

**واتە: بەدوای یەکدا حەج و عومرە بکەن، هەردووکیان هۆکاری نەمانی هەژاری و تاوانە، هەروەکوو چۆن ئاگر پاککەرەوەی پیسی ئاسن و ئاڵتوون و زیوە.**

**٣.** عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «**الْغَازِي**

---

(١) رواه البخاري (١٧٧٣)، ومسلم (١٣٤٩).

(٢) رواه الترمذي (٨١٠)، وابن ماجه (٢٨٨٧)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٢٠٠).

فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالْحَاجُّ وَالْمُعْتَمِرُ، وَفْدُ اللَّهِ، دَعَاهُمْ، فَأَجَابُوهُ، وَسَأَلُوهُ، فَأَعْطَاهُمْ»[١].

واتە: تێكۆشەر لەپێناوى خوا و حاجى و عومرەكار نوێنەرن بۆ لاى پەروەردگار، خواى گەورە بانگى كردن و ئەوانیش وەڵامیان دایەوە، وە چى داوا دەكەن پێیان دەبەخشێت.

**٤.** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «**جِهَادُ الْكَبِيرِ، وَالصَّغِيرِ، وَالضَّعِيفِ، وَالْمَرْأَةِ: الْحَجُّ، وَالْعُمْرَةُ**»[٢].

واتە: جیهادى تەمەن گەورە و بچوك و لاواز و ئافرەت، حەج و عومرەیە.

**٥.** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «**مَنْ خَرَجَ حَاجًّا فَمَاتَ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَجْرَ الْحَاجِّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ خَرَجَ مُعْتَمِرًا فَمَاتَ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَجْرَ الْمُعْتَمِرِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، ...**»[٣].

---

(١) رواه ابن ماجه (٢٨٩٣)، وحسنه الألباني في "الصحيحة" (١٨٢٠).

(٢) رواه النسائي في "الصغرى" (٢٦٢٦)، وحسنه الألباني في تحقيقه الثاني.

(٣) رواه أبو يعلى في "مسنده" (٦٣٥٧)، والطبراني في "الأوسط" (٥٣٢١)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٥٥٣).

واتە: هەرکەسێك بچێت بۆ حەج و لە ڕێگادا بمرێت پاداشتی حەجی بۆ دەنوسرێت تا ڕۆژی دوایی، وە هەرکەسێك بچێت بۆ عومرە و لە ڕێگادا بمرێت پاداشتی عومرەی بۆ دەنوسرێت تا ڕۆژی دوایی، واتە هەتا ڕۆژی دوایی هەر لە حەج و عومرەدان.

**٦**. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «**إِنَّ عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ تَقْضِي حَجَّةً أَوْ حَجَّةً مَعِي**»[(١)].

واتە: عومرەکردنێك لە ڕەمەزاندا وەکوو حەجێك وایە لەگەڵ مندا کردبێتی.

  

(١) رواه البخاري (١٨٦٣)، ومسلم (١٢٥٦).

# ڕوكنەكانی عومرە

١. ئیحرام: واتە: نیەت و وتنی (التلبیة): "لبیك اللهم بالعمرة".

٢. تەوافی كەعبە.

٣. سەعی نێوان سەفا و مەروە.

واتە عومرە بە بێ ئەمانە هەڵدەوەشێتەوە.

# واجبەكانی عومرە

١. پۆشینی ئیحرام لە میقاتەوە.

٢. سەرتاشین یان كورتكردنەوە.

واتە بەبێ ئەمانە عومرە ناتەواوە و بە (فدیة) پڕدەبێتەوە.

# سوننەتەكانی عومرە

بێجگە لە بەشەكانی ڕوكن و واجب هەرشتێكی تر كە باسدەكرێت سوننەتن و بە نەكردنیان لە پاداشت و تەواویی عومرەكە كەم دەبێتەوە، بەدەر لە نەزانین و هەڵە و لەبیرچوون.

۞ پێویستە ئەو موسوڵمانەی كە دەیەوێت عومرە بكات كاتێك دەگاتە میقات (ذوالحلیفة) ئەم كارانە ئەنجامبدات:

١. **خۆشۆردن (غسل):** خۆی بشوات وەکوو چۆن بۆ غوسلە شەرعییەکان خۆی دەشوات، وە پێش خۆشۆردن پێویستییەکانی مووبڕین و نینۆککردن ئەنجام بدات، لەبەرئەوەی نەکەوێتە ناو قەدەغەکراوەکانی ئیحرامەوە.

❁ تەنانەت ئەو ئافرەتانەی کە لە وادەی سووڕی مانگانەدان، یاخود لە وادەی دوای منداڵبووندان، واجبە خۆیان بشۆن و بەرگی ئیحرام بپۆشن و بەشداری هەموو جۆرەکانی مەراسیمی عومرە بکەن، بێجگە لە تەوافی کەعبە و سەعی سەفا و مەروە نەبێت، ئەوانەش لەدوای تەواوبوونیان لە سووڕی مانگانە ئەنجامیان دەدەن، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «الْحَائِضُ وَالنُّفَسَاءُ إِذَا أَتَتَا عَلَى الْوَقْتِ تَغْتَسِلَانِ، وَتُحْرِمَانِ وَتَقْضِيَانِ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا غَيْرَ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ»[1].

٢. **پۆشینی ئیحرام:** پیاوان دەبێت هەموو بەرگێك لە خۆیان دامالْن، هیچ پارچە پۆشاکێکیان پێوە نەمێنێت بێجگە لەو دوو پارچە پۆشاکەی کە پێی دەوترێت (ئیحرام).

---

(١) رواه أبو داود (١٧٤٤)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٨١٨).

۞ ئافرەتان بۆیان هەیە هەموو جۆرە پۆشاكێك بپۆشن لە جۆر و ڕەنگ، بێجگە لە دەسكێش و نیقاب نەبێت، وە هەر پارچەیەك كە دەم و چاوی پێ هەڵبپێچرێت، بەڵام ئەگەر پارچە قوماشێك لە سەریەوە دایباتەوە بەسەر دەم و چاویدا بەبێ هەڵپێچان ئەوا دروستە.

۞ بەرگی ئیحرامی پیاوان و ئافرەتان نابێت هیچ جۆرە بۆنێكی پێوەبێت.

۞ دوای پۆشینی ئیحرام قەدەغەیە پیاوان سەریان داپۆشن بە كڵاو و جامانە و هەر پارچەیەكی تر، یاخود گۆرەوی و خووف و پێڵاو لەپێبكەن، بێجگە لە نەعل نەبێت، وە دەبێت شانی ڕاستیشی داپۆشێت، وەكوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «لاَ يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ القَمِيصَ، وَلاَ العِمَامَةَ، وَلاَ السَّرَاوِيلَ، وَلاَ البُرْنُسَ، وَلاَ ثَوْبًا مَسَّهُ زَعْفَرَانٌ وَلاَ وَرْسٌ، وَلاَ الْخُفَّيْنِ إِلَّا لِمَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ، ...»[1]. وَقَالَ: «وَلاَ تَنْتَقِبِ المَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ، وَلاَ تَلْبَسِ القُفَّازَيْنِ»[2].

---

(١) رواه البخاري (٥٨٠٦)، ومسلم (١١٧٧).

(٢) رواه البخاري (١٨٣٨).

❁ بە پۆشینی بەرگی ئیحرام ناچێتە ناو مەراسیم (عبادة)ی عومرەوە، تاوەکوو بە زمان نەڵێت "لبيك اللهم بالعمرة" خودایە ئامادەم عومرە بۆ تۆ بکەم، واتە پێش وتنی ئەمە ئەگەر پەشیمان بێتەوە لە عومرەکردن؛ ئەوا بە هیچ جۆرێك تاوانبار نابێت و فدیەی لەسەر نییە.

  

# التلبية

دەتوانرێت دوای پۆشینی ئیحرام و (التلبية) کە پێی داخل ئەبێتە ناو عومرەوە، عومرەکار خۆی بشوات و بەرگی ئیحرام بگۆڕێت و سەری شانە بکات، بێجگە لە نینۆککردن و مووڵێکردنەوە و بۆنی خۆش لەخۆدان و نزیکبوونەوە لە خێزان نەبێت، کە ئەمانە هەمووی لە قەدەغەکراوەکانی ئیحرامن.

ئەگەر یەکێك گومانی هەبوو لە تەواوکردنی عومرەکەی بەهۆی نەخۆشی و ڕووداوێکەوە، ئەوا دەتوانێت لەکاتی ووتنی (التلبية) مەرج دابنێت و بڵێ (ئامادەم پەروەردگار عومرە بکەم، بە مەرجێك هەرکاتێك هۆکارێکی ڕێگر هەبوو دەرچم لە ئیحرام)، ئەوکات گەر بۆی تەواونەکرا تاوانبار نابێت و فیدیەی لەسەر ناکەوێت، وەکوو (عائشة) رَضِيَٱللَّهُعَنْهَا دەڵێت: «دَخَلَ رَسُولُ اللهِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَ لَهَا: **"لَعَلَّكِ أَرَدْتِ الحَجَّ؟"** قَالَتْ: وَاللهِّ لاَ أَجِدُنِي إِلَّا وَجِعَةً، فَقَالَ لَهَا: **"حُجِّي وَاشْتَرِطِي، وَقُولِي: اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي"**»[١].

---

(١) رواه البخاري (٥٠٨٩).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای (زوباعەی کچی زوبێر) و فەرمووی: ڕەنگە ویستی حەجت هەبوو بێت؟ وتی: بەردەوام نەخۆشم و ئازارم هەیە، فەرمووی: حەج بکە و بە مەرجی بگرە و بڵێ: ئامادەم حەج بکەم بەمەرجێك هەر ڕێگرێك هەبوو دەرچم لە ئیحرام.

❁ دەتوانرێت پۆشاکی ئیحرام بپۆشرێت پێش (میقات) کە (ذو الحليفة)یە و پێی دەڵێن (أبيار علي)، بەمەرجێك تا دەگەنە میقات نابێت نیەت بێنن و (التلبية) بکەن.

تاوەکوو (التلبية) نەڵێن ناچنە ناو مەناسیکی عومرەوە، لەبەرکردنی ئیحرام وەك دەستنوێژگرتن وایە بۆ نوێژ، وە وتنی (التلبية)ش وەکوو (الله أكبر)ی دابەستنی نوێژ وایە، وەکوو (ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «انْطَلَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ المَدِينَةِ بَعْدَ مَا تَرَجَّلَ، وَادَّهَنَ وَلَبِسَ إِزَارَهُ وَرِدَاءَهُ هُوَ وَأَصْحَابُهُ، ...»[1].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە دەرچوو لەگەڵ هاوەڵەکانیدا پاش لەبەرکردنی ئیحرام و قژداهێنان و چەورکردنی.

❁ **نوێژی سوننەتی پاش پۆشینی ئیحرام:** وەکوو سوننەت هیچ فەرموودەیەکی لەسەر نەهاتووە، بەڵام دەتوانرێت دوو ڕکاتی

---

(١) رواه البخاري (١٥٤٥).

دەستنوێژ بێت یاخود چوونە مزگەوت بێت، یان هەر سوننەتێکی تر بێت لە مزگەوتەکەی (ذو الحليفة) بکەیت، بەڵکوو نوێژکردن لە میقاتی (ذو الحليفة) سوننەتە و شوێنێکی بەبەرەکەتە، وەکوو لەم فەرموودانەدا هاتووە:

١. عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَادِي العَقِيقِ يَقُولُ: «أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتٍ مِنْ رَبِّي، فَقَالَ: صَلِّ فِي هَذَا الوَادِي المُبَارَكِ، وَقُلْ: عُمْرَةً فِي حَجَّةٍ»[1].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وتی: گوێم لێبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمشەو نێردراوێك لای پەروەردگارمەوە هات و وتی: نوێژ لەم شیوە بەرێز و بەرەکەتدارەدا بکە.

٢. عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قِيلَ لَهُ: «إِنَّكَ بِبَطْحَاءَ مُبَارَكَةٍ»[2].

واتە: تۆ لە شوێنێکی تەختایی بەبەرەکەتدایت.

٣. إِنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، كَانَ يَقُولُ: «كَانَ رَسُولُ

(١) رواه البخاري (١٥٣٤).

(٢) رواه البخاري (١٥٣٥).

اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْكَعُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ[1].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی لە میقاتی (ذو الحليفة) کرد.

❁ پاش نوێژەکە هەر لە سنووری مزگەوتی (ذو الحليفة)دا ڕوو بکەرە قیبلە و بڵێ: «لَبَّيْكَ اللهُمَّ بِالْعُمْرَةِ، لَا رِيَاءَ فِيهَا وَلَا سُمْعَةَ».

واتە: ئامادەم پەروەردگار عومرە بکەم بە بێ ڕیا و دەربڕین.

❁ لەدوای وتنی ئەمەی پێشوو دەچێتە ناو مەراسیمی عومرەوە، پاشان بەردەوامبوون لەسەر وتنی (التلبية) کە بریتییە لە: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ». واتە: ئامادەم خوای پەروەردگار ئامادەم، هیچ هاوەڵ و شەریکێکت نییە و هەموو سوپاس و ستایش و نیعمەتێك بۆ تۆیە لەگەڵ هەموو موڵك و بوونێکدا، هیچ هاوەڵ و شەریکێکت نییە.

ئەم زیکرە واجب دەبێت بەگوێرەی توانا و تێکەڵکردنی زیکر و نزا و قورئانخوێندن لە نێوانیاندا، بەمەرجێك هەریەکێك بۆخۆی بیکات بە دەنگی بەرز.

---

(١) رواه مسلم (١١٨٤).

دەبێت ئەم زیکرە کە شیعاری عومرە و حەجە، زۆر و بەردەوام زیکری سەر زوبانی بێت، تا دەگاتە (مەککە) یاخود بەردەم (حجر الأسود).

❁ دەتوانرێت ئەم جۆرانەش تێکەڵی (التلبية) بکرێت:

١. «لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ لَبَّيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ»[(١)].

٢. «لَبَّيْكَ إِلَهَ الْحَقِّ، لَبَّيْكَ»[(٢)].

٣. «لَبَّيْكَ ذَا الْمَعَارِجِ، وَلَبَّيْكَ ذَا الْفَوَاضِلِ»[(٣)].

❁ وە سوننەتە ئەم زیکرانە هەریەکە بۆخۆی بیکات بە دەنگی بەرز، بە بەڵگەی ئەم فەرموودانە:

١. قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أَتَانِي جِبْرِيلُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي وَمَنْ مَعِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ»[(٤)].

---

(١) رواه مسلم (١١٨٤).

(٢) رواه ابن ماجه (٢٩٢٠)، والنسائي في "الكبرى" (٣٧١٨)، وصححه الألباني.

(٣) رواه البيهقي في "السنن الكبرى" (٩٠٣٢)، وانظر "مناسك الحج والعمرة" للألباني ص١٧.

(٤) رواه أبو داود (١٨١٤)، وصححه الألباني.

واتە: (جبریل) عليه السلام هات بۆلام و فەرمانی پێدام فەرمان بدەم بە هاوەڵانم و ئەوانەی کە لەگەڵمن دەنگ بەرزکەنەوە بە (التلبية).

**٢.** قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «**أَفْضَلُ الْحَجِّ الْعَجُّ وَالثَّجُّ**»(١).

واتە: باشترین حەج (العج): واتە دەنگ بەرزکردنەوەیە بە (التلبية)، وە (الثج): خوشەی خوێنڕشتنی قوربانییە.

**٣.** قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «**مَا مِنْ مُلَبٍّ يُلَبِّي إِلَّا لَبَّى مَا عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ شِمَالِهِ مِنْ شَجَرٍ وَحَجَرٍ حَتَّى تَنْقَطِعَ الْأَرْضُ مِنْ هُنَا وَهُنَا**»(٢).

واتە: هەرکەسێك (التلبية) بلێت، ئەوا هەرشتێك هەیە لای ڕاستی و چەپی لە درەخت و بەرد و هەرچی لەملاو لایدایە هەمووی وەکوو ئەو (التلبية) دەڵێنەوە.

**٤.** قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «**كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ هَابِطًا مِنَ الثَّنِيَّةِ، وَلَهُ جُؤَارٌ إِلَى الله بِالتَّلْبِيَةِ**»(٣).

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في "مصنفه" (١٥٠٥٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٥٠٨٦)، والبيهقي في "الشعب" (٦٩٣٨)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٥٠٠).

(٢) رواه ابن ماجه (٢٩٢١)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (١١٣٣).

(٣) رواه البخاري (٣٣٥٥)، ومسلم (١٦٦).

واته: هەروەك دەبینم (موسی) ﷵ لەسەر تەپۆڵكەیەك دێته خوارەوە و بە دەنگی بەرز (التلبیة) دەڵێت.

وە (أبو حازم) دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بە دەنگی بەرز دەیانوتەوە نەدەگەیشتنە مەككە دەنگیان دەنوسا[١].

وە ئافرەتانیش دەبێت ئەوەندەی كە خۆیان و هاوەڵانیان بیبیستن دەنگ بەرزبكەنەوە.

  

(١) أنظر "مناسك الحج والعمرة" للألباني ص١٧.

# چۆنیەتی چوونە ناو مزگەوتی ( حەرەم )

**پێویستە ڕەچاوی ئەم شێوازانەی خوارەوە بکرێت:**

بێگومان حەرامە و نابێت ئافرەتان کە لە سووڕی مانگانەدان بچنە ناو مزگەوتی حەرام و تەواف ئەنجام بدەن، هەروەك پێغەمبەر ﷺ بە (عائیشە)ی خێزانی فەرموو: «فَاقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ، غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَغْتَسِلِي»[1].

واتە: دەبێت هەموو کارێك کە حاجی دەیکات ئەنجامی بدەیت (لە خۆشۆردن و ئیحرام و تەلبیە) بێجگە لە تەواف نەبێت هەتا خۆت دەشۆیت (واتە تا تەواو دەبیت).

١. قاچی ڕاستت پێش بخە و بڵێ: «فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ لِيَقُلْ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ»[2].

واتە: (بسم الله) بکە و سڵاوات لە پێغەمبەر ﷺ بدە و بڵێ: پەروەردگار دەرگای بەزەیی خۆتم بۆ بکەیتەوە.

---

(١) رواه البخاري (٢٩٤)، ومسلم (١٢١١).

(٢) رواه ابن ماجه (٧٧٢)، وأبو داود (٤٦٥)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٥١٤).

**یاخود ئەم زیکرە بکە:**

✍ «أَعُوذُ بِاللهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ»[(١)].

**٢.** ئەگەر کەعبەت لێدەرکەوت بوەستە و هەردوو دەستت هەڵبڕە و ڕووەو کەعبە دوعا بکە، وە ئەگەر دوعاکەی (عومەری کوڕی خەتتاب) ﷺ بکەیت باشترە کە دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ، وَمِنْكَ السَّلاَمُ، فَحَيِّنَا رَبَّنَا بِالسَّلاَمِ»[(٢)].

واتە: خوای پەروەردگار تۆ ناوت سەلامە و سەلامەتی هەر لای تۆوەیە، بمانژیێنە بە سەلامەتی.

بەم شێوەیە ئیمامی عومەر و عبداللە ی کوڕی عباس ﷺ دەستیان بەرز کردۆتەوە و دوعایان کردووە لەکاتی بینینی کەعبەدا.

  

---

(١) رواه أبو داود (٤٦٦)، والبيهقي في "الدعوات الكبير" (٦٨)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٤٧١٥).

(٢) رواه البيهقي في "السنن الكبرى" (٩٢١٦)، وانظر "مناسك الحج والعمرة" للألباني ص٢٠.

# تەوافی کەعبە

بەرەو (الحجر الأسود) دەڕۆیت تا دەگەیتە بەردەمی، کاتێك گەیشتیتە بەردەمی لەسەر ڕای (عبدالله ی کوڕی عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا کۆتایی بە (التلبية) دێت، پاشان دەست دەکەیت بەم کارانە:

**❁ شانی ڕاستت دەردەخەیت:**

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابَهُ «**اعْتَمَرُوا مِنَ الْجِعْرَانَةِ فَرَمَلُوا بِالْبَيْتِ وَجَعَلُوا أَرْدِيَتَهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ قَدْ قَذَفُوهَا عَلَى عَوَاتِقِهِمُ الْيُسْرَى**»[(١)].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی کە عومرەیان کرد ئیحرامەکانیان دا بەسەر شانی چەپیاندا و شانی ڕاستیان دەرخست.

❁ دەبێت هەر حەوت تەوافەکە شانی ڕاستت دەرکەوێت و دانەپۆشرێت، هەروەك (ابن يعلى) لە باوکیەوە دەیگێڕێتەوە: «**أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ بِالبَيْتِ مُضْطَبِعًا**»[(٢)].

---

(١) رواه أبو داود (١٨٨٤)، وصححه الألباني في "الإرواء" (١٠٩٤).

(٢) رواه الترمذي (٨٥٩)، وحسنه الألباني.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی بەدەوری ماڵی خوادا بە شان ڕووتکراوی بوو، واتە (هەر حەوت تەوافەکە)، ئەمە بەرپەرچدانەوەی ئەو قسەیەیە کە دەڵێن دەبێت لەدوای سێ تەوافی هەروەلەکەی کەعبە شان داپۆشرێت، لەبەرئەوەی کە هەروەلە تەواو بوو ئەوا شان داپۆشینیش تەواو دەبێت[١].

❁ پاشان بەرەو (الحجر الأسود) بڕۆ، گەر گونجا و بۆت ڕەخسا دەستی لێبدە و ماچی بکە و سوجدەی لەسەر ببە.

عَنْ نَافِعٍ، قَالَ: «رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَبَّلَ يَدَهُ، وَقَالَ: مَا تَرَكْتُهُ مُنْذُ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُهُ»[٢].

واتە: (عبدالله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەستی لە (الحجر الأسود) دەدا و ماچی دەکرد و دەیوت: وازم لێنەهێناوە لەوکاتەوەی کە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە کردوویەتی.

وە ئیمامی (عبد الله ی کوڕی عومەر و عبد الله ی کوڕی عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم سوجدەیان لەسەر بردووە[٣].

---

(١) انظر "حجة النبي ﷺ" للألباني ص٥٨.

(٢) رواه مسلم (١٢٦٨).

(٣) انظر "الإرواء" للألباني (١١١٢).

گەر بۆت نەڕەخسا ماچی بکەیت، ئەوا دەستی لێبدە و دەستت ماچ بکە، گەر ئەوەشت بۆ نەکرا ئەوا دەستی ڕاستت هەڵبڕە و هەموو ڕووی جەستەتی تێبکە وەك سەلام لێکردنی و بڵێ: "بسم الله، الله أكبر" یاخود هەر "الله أكبر".

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ «يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَإِذَا انْتَهَى إِلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ»[1].

وَعَنْ جَابِرٍ، قَالَ: «طَافَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْبَيْتِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى رَاحِلَتِهِ يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بِمِحْجَنِهِ، ...»[2].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا تەوافی بەسەر حوشترەکەیەوە کرد و بە سەری گۆچانەکەی دەیدا لە (الحجر الأسود) و ماچی دەکرد.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ بە (عومەری کوڕی خەتتاب)ی فەرموو: «يَا عُمَرُ، إِنَّكَ رَجُلٌ قَوِيٌّ، لَا تُزَاحِمْ عَلَى الْحَجَرِ فَتُؤْذِيَ الضَّعِيفَ، إِنْ وَجَدْتَ خَلْوَةً فَاسْتَلِمْهُ، وَإِلَّا فَاسْتَقْبِلْهُ فَهَلِّلْ وَكَبِّرْ»[3].

---

(١) رواه الترمذي (٨٦٥)، والنسائي في "الكبرى" (٣٩١٢)، وصححه الألباني.

(٢) رواه مسلم (١٢٧٣). (٣) رواه أحمد في "المسند" (١٩٠)، وحسنه الأرنؤوط.

واتە: ئەی (عمر) تۆ پیاوێکی بەهێزی ئازاری لاواز مەدە، گەر چۆڵ بوو ئەوا دەستی لێبدە، وە گەر نا ڕووی تێبکە و "الله أكبر" بکە.

وە (عبد الله ی کوڕی عمر)یش رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا لەکاتی دەستلێدانی (الحجر الأسود)دا دەیوت: «بِسْمِ اللهِ وَاللهُ أَكْبَرُ»[(١)].

وە (عبد الله کوڕی عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ بِالْبَيْتِ وَهُوَ عَلَى بَعِيرٍ، كُلَّمَا أَتَى عَلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ فِي يَدِهِ، وَكَبَّرَ»[(٢)].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی دەکرد بەسەر وشترەکەیەوە و هەرکاتێك بگەیشتایەتە ئاستی (الحجر الأسود) بە هەرشتێك کە بەدەستیەوە بوایە ئاماژەی بۆ دەکرد و "الله أكبر"ی دەکرد.

❁ پاشان کەعبە بخەرە لای چەپتەوە و (حەوت) جار تەوافی کەعبە ئەنجام بدە، پیاوان سێ تەوافی سەرەتا دەبێت بە (هەروەلە) واتە ڕۆشتنی خێرا ئەنجام بدەن و چوار تەوافەکەی تر بە ڕۆیشتنی ئاسایی، وە لە هەر حەوت تەوافەکەدا دەبێت شانی ڕاستیان دەرکەوێت.

---

(١) رواه عبد الرزاق في "المصنف" (٨٨٩٤).

(٢) رواه البخاري (١٦٣٢).

هەموو تەوافێك لـە (الحجر الأسود) دەست پێدەكات و دەبێت هەر لـەوێش كۆتایی پێبێت، وە سەرەتای هەموو تەوافێك دەبێت هەموو ڕووت بكەیتە (الحجر الأسود) و دەستی ڕاستت هەلـبڕیت وەك سەلام كردن بۆی و بلـێی "الله أكبر".

عَنْ ابْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ: «أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ بِالبَيْتِ مُضْطَبِعًا ...»[1].

واتە: هەر حەوت تەوافەكانی بە شان ڕووتكراوی بوو.

وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: «رَمَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْحَجَرِ إِلَى الْحَجَرِ ثَلَاثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا»[2].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی كەعبەی ئەنجامدا شانی دەركەوتبوو، وە سێ جار بە ڕۆشتنی خێرا (هەروەلـە) تەوافی ئەنجامدا و چوارەكەی تر بە ڕۆیشتنی ئاسایی.

۞ گەیشتن بە ئاستی (الركن اليماني) كە دەكەوێتە سوچی ڕاستی پێش (الحجر الأسود)ەوە، سوننەتە دەستی پێدابهێنیت بەبێ ماچكردن

---

(١) رواه الترمذي (٨٥٩)، وحسنه الألباني.

(٢) رواه مسلم (١٢٦٢).

و وتنی "الله أكبر"، ئەگەر نەتتوانی ئەوا بەجێی دەهێڵێت بەبێ دەست هەڵبڕین و وتنی "الله أكبر".

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنَّ مَسْحَ الْحَجَرِ الْأَسْوَدِ، وَالرُّكْنِ الْيَمَانِيِّ يَحُطَّانِ الْخَطَايَا حَطًّا»[(١)].

واتە: دەستلێدانی (الحجر الأسود) و (الركن اليماني) تاوان دەسڕێتەوە.

وَعَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ قَالَ: «لَمْ أَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَلِمُ مِنَ البَيْتِ إِلَّا الرُّكْنَيْنِ اليَمَانِيَيْنِ»[(٢)].

واتە: (ابن عمر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: نەمبینی پێغەمبەری خوا ﷺ دەست بدات لە سووچەکانی کەعبە بێجگە لە (الحجر الأسود) و (الركن اليماني) نەبێت.

ئەم دەستلێدانەش دەتوانێت لە هەموو تەوافێکدا ئەنجامی بدات.

---

(١) رواه عبد الرزاق في "مصنفه" (٨٨٧٧)، والطبراني في "الكبير" (١٣٤٣٨)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٢١٩٤).

(٢) رواه البخاري (١٦٠٩)، ومسلم (١٢٦٧).

❁ کاتێك تێپەڕ بوویت لە (الركن اليماني) بەرەو (الحجر الأسود) لە نێوانیاندا ئەم زیکرە بخوێنە: «رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ»[(١)].

بێجگە لەم زیکرە هیچ جۆرە زیکر و نزایەکی دیاریکراومان نییە، بەڵکوو هەرکەس چی دەزانێت لە زیکر و دوعا دەتوانێت بیخوێنێت.

وە نابێت سەرقاڵ بیت بە قسە و بابەتی دونیاییەوە لەکاتی ئەنجامدانی حەوت تەوافەکەدا، لەبەرئەوەی لە ناو عیبادەتدایت، وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ صَلَاةٌ، وَلَكِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ أَحَلَّ فِيهِ الْمَنْطِقَ، فَمَنْ نَطَقَ فَلَا يَنْطِقْ إِلَّا بِخَيْرٍ»[(٢)]، وَفِي رِوَايَةٍ: «فَأَقِلُّوا فِيهِ الْكَلَامَ»[(٣)].

واتە: تەوافی کەعبە نوێژە، بەڵام خوای گەورە ڕێگەی داوە بە قسەکردن تێیدا، گەر کەسێك قسەی کرد با قسەی خێر نەبێت نەیکات، یاخود قسەی کەمی تێدا بکەن.

---

(١) رواه أبو داود (١٨٩٠)، وحسنه الألباني.

(٢) رواه ابن أبي شيبة في "مصنفه" (١٢٨٠٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٨٣٦)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٣٩٥٤).

(٣) رواه ابن أبي شيبة في "مصنفه" (١٢٨١١).

بە تەواو کردنی تەوافی حەوتەم و گەیشتنەوەت بە ئاستی (الحجر الأسود) پێویست ناکات ڕووبکەیتەوە (الحجر الأسود) و دەست هەڵبڕیت و "الله أكبر" بکەیت، لەبەرئەوەی ئەمانە کاری سەرەتا کردنەوەی تەوافە، تۆ تەوافێکی تر بێجگە لە حەوتەکە ئەنجام نادەیت.

۞ پاش حەوت تەوافەکە پیاوان شانیان دادەپۆشن.

هەندێك بە هەڵەدا چوون کە دەڵێن دەبێت لە دوای سێ تەوافەکەی سەرەتا کە (هەروەلە)ی تێدا کۆتایی دێت، شان ڕووتکردنیش تیایدا کۆتایی بێت، بەڵام زۆری ڕای زانایان لەسەر خوێندنەوەی ڕووکەشی فەرموودەکەن، کە دەفەرموێت (طاف) واتە تەوافەکەی ئەنجامدا، وە تەوافیش بە هەر حەوتی دەوترێت.

📖 بۆ دڵنیابوونیش بڕوانە ئەم سەرچاوانەی زانایان:

١. "سبل السلام" للصنعاني (٢/٩٨٦) .

٢. "المغني" لإبن قدامة (٤/٥٥٩) .

٣. "فتاوى اللجنة الدائمة" (١١/٢٢٥) .

٤. "توضيح الأحكام شرح بلوغ المرام" لعبد الله بسام (٣/٣٧) .

٥. "حجة النبي صلى الله عليه وسلم" للألباني ص٥٨ .

❁ پاشان بەرەو (مقام ابراهيم) دەڕۆن، کە گەیشتنە (مقام ابراهيم) سوننەتە ئەم ئایەتە بخوێندرێتەوە: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ [البَقَرَة : ١٩٥]، پاشان دوو ڕکات نوێژ بکە و لە ڕکاتی یەکەمدا سوورەتی ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ی تێدا بخوێنە و لە ڕکاتی دووەمیشدا سوورەتی ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنە.

ئەگەر گونجا (مقام ابراهيم) بخەرە نێوان خۆت و کەعبەوە، گەر دووریش بیت لێی، وە ئەگەر نا لە هەر شوێنێکی مزگەوت بێت دروستە، لەبەر فەرموودەکەی (جابر بن عبد الله) ﵁ کە دەڵێت: «ثُمَّ نَفَذَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلَام، فَقَرَأَ ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ [البَقَرَة : ١٩٥]، فَجَعَلَ الْمُقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْت فكَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ وَ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾»[١].

باش وایە لە شوێنێکدا نوێژ بکەیت کە کەس بە بەردەم نوێژەکەتدا تێپەڕ نەبێت، وە هەوڵ بدە بە بەردەم هیچ نوێژخوێنێکدا تێپەڕ نەبیت،

---

(١) رواه مسلم (١٢١٨).

لەبەر ئەم هەڕەشەیەی لەم فەرموودەیەدا هاتووە: «لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ»(١).

واتە: گەر ئەو کەسەی کە بە بەردەم نوێژخوێنێکدا تێپەڕدەبێت بزانێت چەندە تاوانبار دەبێت؛ چل ساڵ بووەستێت باشترە لەوەی تێپەڕبێت.

❁ دوای لێبوونەوەی نوێژەکە بەرەو ئاوی زەمزەم بڕۆ و لێی بخۆرەوە بە هەر نییەتێکی تایبەتیت بێت ئەوا دێتە دی، وە هەندێکی بکە بە سەرتدا و تەڕی بکە.

باشترین شێوازی خواردنەوەی ئاوی زەمزەم و نییەتەکەشی ئەوەیە کە ڕوو بکەیتە قیبلە و ناوی خوای لەسەر بێنی و بە سێ جار بیخۆیتەوە، وە کە لێبویتەوە سوپاسی خوا بکەی لەسەری و دوعاکەی (ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا بکەیت کە دەیوت: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا، وَرِزْقًا وَاسِعًا، وَعَمَلًا مُتَقَبَّلًا، وَشِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ»(٢).

واتە: خوای پەروەردگار داوای زانستی بەسوود و ڕۆزی فراوان و

(١) رواه البخاري (٥١٠)، ومسلم (٥٠٧).

(٢) رواه الدارقطني في "سننه" (٢٧٣٨)، وصححه الألباني في "الإرواء" (٤/ ٣٣٢).

کاری وەرگیراو و شیفا لە هەموو دەردێکت لێدەکەم.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَاءُ زَمْزَمَ، لِمَا شُرِبَ لَهُ»[(١)].

واتە: ئاوی زەمزەم بۆ هەر نییەتێکە.

وە دەفەرموێت: «إِنَّهَا مُبَارَكَةٌ، وَهِيَ طَعَامُ طُعْمٍ، وَشِفَاءُ سُقْمٍ»[(٢)].

واتە: زەمزەم بەبەرەکەتە و خۆراکی برسییە و شیفای نەخۆشییە.

❁ پاشان بگەڕێرەوە بۆ (الحجر الأسود) و دەستی لێبدە و ماچی بکە، گەر نەتتوانی لە دوورەوە دەستی بۆ هەڵبڕە و "الله أكبر" بکە، وەکوو لە فەرموودەکەی (جابر بن عبدالله)دا رضي الله عنه هاتووە کە دەڵێت: «ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ»[(٣)].

واتە: پێغەمبەر ﷺ پاشان گەڕایەوە بۆ (الحجر الأسود) و دەستی لێدا.

  

---

(١) رواه ابن ماجه (٣٠٦٢)، وصححه الألباني في "الإرواء" (١١٢٣).

(٢) رواه الطبراني في "الصغير" (٢٩٥)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٢٤٣٥).

(٣) رواه مسلم (١٢١٨).

# سـەعی نێوان سەفا و مەروە

❁ تەوافی نێوان سەفا و مەروە حەوت جارە، بەرەو بەرزایی سەفا بڕۆ، کە گەیشتیتە سەر بەرزایی سەفا ئەم ئایەتە بخوێنە: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ [البَقَرَة: ١٥٨].

❁ پاشان ڕوو بکەرە کەعبە و ئەم زیکرە بخوێنە: «اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ»[١].

❁ پاشان دەست هەڵبڕە و نزا و دوعا بۆ خۆت بکە، وە جاری دووەمیش بیلێرەوە و لە دواییدا دەست هەڵبڕە و دوعا بکە، وە سێهەم جاریش بیلێرەوە، بەڵام لە دواییدا دوعا مەکە و بڵێ: «أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللهُ بِهِ»[٢].

---

(١)، (٢) رواه مسلم (١٢١٨).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: بەو شێوەیە دەست پێدەکەم کە خوای پەروەردگار دەستی پێکردووە، واتە لە باسدا کە (سەفای پێش مەروە) باس کردووە، منیش لە پێشدا دەچمە سەر سەفا و پاشان مەروە.

❁ پاشان بەرەو (مەروە) بکەوەرە ڕێ بە شێوازی ئاسایی تا دەگەیتە ئاستی گلۆپە سەوزەکە، دەبێت پیاوان لە نێوان هەردوو گلۆپە سەوزەکەدا ڕاکردنی هێواش (هەروەلە) بکەن بێجگە لە ئافرەتان، لەدوای کۆتایی گلۆپە سەوزەکە بە شێوازی ئاسایی ڕێ بکە تا دەگەیتە سەر بەرزایی (مەروە).

لەنێوان سەفا و مەروە هیچ زیکر و نزایەکی دیاریکراو نییە، بێجگە لە نزاکەی (عبداللە ی کوڕی مسعود) و (عبداللە ی کوڕی عباس) رضي الله عنهم کە دەیانوت: «رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ إِنَّكَ أَنْتَ الْأَعَزُّ الْأَكْرَمُ»[1].

واتە: پەروەردگار داوای لێخۆشبوون و بەزەییت لێدەکەم، تۆ بالادەست و بەخشندەیت.

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في "مصنفه" (١٥٥٦٥)، والطبراني في "الدعاء" (٨٧٠)، وانظر "مناسك الحج والعمرة" للألباني ص٢٧.

❁ کە گەیشتیتە سەر بەرزایی (مەروە)، بەبێ خوێندنی ئایەتەکە[1] ڕوو بکەرە کەعبە و زیکرەکە بە شێوازی پێشوو بڵێرەوە و لە نێوان یەکەم و دووەمدا دەست هەڵبڕە و نزا و دوعای تایبەتی خۆت بکە و لە دوای سێیەم جار دوعا ناکەیت، بەرەو سەفا بەهەمان شێوە بەڕێدەکەویت و لە نێوان گڵۆپە سەوزەکەدا لە هەموو تەوافێکدا پیاوان ڕاکردن و هەروەلە دەکەن.

بۆ پێشەکی (افتتاح) و سەرەتا کردنەوەی یەکەمجاری سەر سەفاو مەروە زیکرەکە دەخوێندرێت، بەڵام بۆ جارەکانی تری هاتنەوەی سەر سەفاو مەروە نابێت بخوێنرێت، ئەمە وەکوو (الحجر الأسود) نییە کە هەرجارێك گەیشتیتەوە سەری ڕووی تێدەکەیت و سەلام و "الله أکبر" بکەیت، ئەوە تایبەتە بە (الحجر الأسود)[2].

بەم شێوەیە لە سەفاوە بۆ مەروە تەوافی یەکەمە و لە مەروەشەوە بۆ سەفا تەوافی دووەمە، تاوەکوو حەوتەم جار لەسەر مەروە کۆتایی دێت.

هەندێك بەهەڵەدا دەچن بەوەی کە لە سەفاوە بۆ مەروە و چوونەوە سەر سەفا بە تەوافێك دادەنێن، کە ئەمەش دەکاتە چواردە

---

(١) رواية جابر عند النسائي برقم (٢٩٧٤).

(٢) انظر "الشرح الممتع" للعثيمين (٧/ ٢٧)، و "الجامع لأحكام" (٢/ ٢٩١).

تەواف، لە کاتێکدا حەوت تەواف واجبە، بەڵکوو نێوانی هەموو سەفا و مەروەیەك تەوافێکە، بە بەڵگەی ئایەتەکەی خوای پەروەردگار کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾[البَقَرَة: ١٥٨]. لە سەفاوە بۆ مەروە یەکێکە لە نیشانە و فەرمانی خوایی بۆ حەج و عومرە.

بۆیە تەوافی (کەعبە) حەوت تەوافە لە کاتێکدا کە ڕوکنە، چ جای تەوافی نێوان سەفا و مەروە کە واجبە لای کۆی زانایان.

وە بۆ تەوافی (کەعبە) خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ﴾ [الحَج: ٢٩]. بە فەرمان، بەڵام بۆ سەفا و مەروە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ﴾ [البَقَرَة: ١٥٨]. فەرمان نییە، ئایا دەکرێت ئەوەی کە فەرمانە حەوت تەواف بێت و ئەوەشی کە فەرمان نییە چواردە بێت ؟!

وە هەروەها لە فەرموودەکانیشدا بۆ تەوافی کەعبە و سەعی نێوان سەفا و مەروە بە یەك شێوە هاتوون کە دەفەرمووێت پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی کرد: «طَافَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِالْبَيْتِ، وَبِالصَّفَا وَالْمُرْوَةِ»[1].

---

(١) رواه مسلم (١٢٧٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە (حجة الوداع)دا تەوافی بە کەعبە و سەفا و مەروە کرد. واتە هەردووکیان حەوت تەوافن.

وە هەروەها تەوافی کەعبە لە (قِران)دا دوو جار دەکرێت، بەڵام تەوافی سەفا و مەروە یەك جار دەکرێت، کەواتە تەنانەت لە پێکەوەبوونی حەج و عومرەشدا (قِران) تەوافی سەفا و مەروە یەك جار پێویستە و لەسەرت لادەچێت، بۆیە دەبینین لە ڕووی حوکمیشەوە ناگاتە تەوافی کەعبە، کە بە دڵنیایی حەوتە و هیچی لێ زیاد ناکرێت.

  

# سەر تاشین یاخود کورتکردنەوە

لەپاش تەواوبوونی تەوافی سەفا و مەروە کۆتا واجبی عومرە دەمێنێت پێش لەخۆکردنەوەی بەرگی ئیحرام، واتە نابێت ئیحرام لابرێت تاوەکوو سەرتاشین یاخود کورتکردنەوەی ئەنجام دەدرێت، گەر کەسێك بە هەڵە و نەزانین لایبرد، دەبێت لەبەری بکاتەوە و پاشان سەری بتاشێت.

۞ پێویستە ئەگەر سەر بتاشرێت یاخود کورت بکرێتەوە، لە هەموو سەر بگیرێت یاخود بتاشرێت، نەك چەند تەڵێك لە مووی سەر ببڕدرێ، ئەم شێوازە واجبەکەی پێ ئەنجام نادرێت.

ئافرەتان کورتکردنەوەیان لەسەر واجبە، بە لێگرتنی قژیان بە هێندەی نینۆکی ئادەمیزاد، لە هەموو خوارووی قژیان یاخود پەلکەکانیان، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ حَلْقٌ، إِنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ التَّقْصِيرُ»[1].

واتە: تاشین لەسەر ئافرەتان نییە، بەڵکوو کورتکردنەوەیە.

وە باشترین جۆریان تاشینە بۆ پیاوان: ﴿لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن

(١) رواه أبو داود (١٩٨٤)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٦٠٥).

